



# ئەو ڕێوییەی لە پێکەنیندا قرتا

گوڵنار گوللوئۆڵو




زنجیرە چیرۆکی ئاکارە جوانەکان - ٥

# ئەو ڕێوییەی لە پێکەنیندا قرتا

نووسینی: گوڵنار گوللوئۆڵو
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: شوبات - ٢٠١٤
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0)750 713 80 00



# کەڵەشێری دەنگ زوڵاڵ

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. چەندین ساڵ لەمەوبەر کێڵگەیەکی زۆر جوان هەبوو. لەم کێڵگەیەدا کۆمەڵێک گیانداری یەک لەیەک جوانتر و ئیشکەر پێکەوە دەژیان. نە مریشکەکان شانازییان بە هێلکەکانیانەوە دەکرد، نە مانگاکانیش بەو سەتڵە شیرانەوە دەنازین کە ڕۆژانە پێشکەشیان دەکرد.



جا بۆئەوەی کاروبارەکانی ناو کێڵگەکە بەباشی و ڕێک و پێکی ڕاپەڕێت، دەبوایە بەیانیان زوو لەخەو هەستن. بە ئاگا هێنانەوەی جوتیار و گیاندارانی کێڵگەکە ئەرکی کەڵەشێری دەنگ زوڵاڵ بوو. کەڵەشێری پۆپنە سوور شەوان زوو دەنوست و بەیانیانیش زوو لەخەو هەڵدەستا، بۆیە کەس نەبوو لەپێش ئەوەوە بەیانی باش لە ڕۆژی نوێ بکات. خاوەنی کێڵگەکەش ئەوەندە لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو کە کەڵەشێری دەنگ زوڵاڵ بەر لە خۆر هەڵهاتن خەبەری بکاتەوە، چەندین ساڵ بوو دەمژمێری نەنابووەوە.

سەرپەرشتیارانی کێڵگەکە هەر کە لەخەو هەڵدەستان، یەکسەر دانیان دەدا بە ئاژەڵەکان و مەڕ و مانگاکانیاشیان دەدۆشی. ئەو ئاژەڵانەی لەدەرەوەی کێڵگەکە دەلەوەڕان، دەڕۆیشتن و ئەوانەشیان کە بۆ ئیش بەکار دەهێنران لەگەڵ خاوەنەکانیان دەردەچوون و ئێوارە هەموو پێکەوە دەگەڕانەوە.

بۆیە ئەرکی کەڵەشێری دەنگ زوڵاڵ زۆر گرنگ بوو. قوقە قوقی ئەو وەک زەنگی لەخەو هەستان وابوو.





ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆی، ئەوەبوو ڕۆژێکیان دۆستانی کەڵەشێرەکە کۆبوونەوە و پێیان وت پێویستە تەلەفزیۆنێک بکڕێت. تەنانەت ئەوەندە پێداگرییان کرد وازیان لێ نەهێنا تا بەڵێنی دا بیکڕێت. ئینجا کەوتنە باسکردنی یاریی تۆپی پێ و فلیم و بەڵگەنامەییەکانی تەلەفزیۆن بۆی.

دواتر چوونە بنکڵێشەی و خستیانە مێشکییەوە کە نابێت ئەو بەرنامانەی لە دەست دەربچێت کە تایبەتە بە ئابووری وڵات. هەروەها سەرسوڕماوی خۆیان دەربڕی لەوەی کە چۆن کەڵەشێرێکی بێ ئاگا لەم شتانە لە کاتی دان خواردندا دەنکە گەنمەشامی لە گەرووی ناگیرێت.





کەڵەشێری دەنگ زوڵاڵ لەبەردەم داواکارییەکاندا خۆی پێ ڕانەگیرا و لە کۆتاییدا تەلەفیزیۆنێکی کڕی و هێنایە ناو کولانەکەوە. مریشکەکانیش خواخوای شتێکی وایان بوو. ڕۆژ ڕۆژی جوجەڵەکان بوو، شەو و ڕۆژ تەماشای فلیم کارتۆنیان دەکرد. لە پاش هەفتەیەک جامی جیهانی تۆپی پێی کەڵەشێرەکان دەستی پێکرد. ئیتر هەر ئەوەندەی یارییەک هەبووایە کاکی کەڵەشێر لەبەردەم تەلەفزیۆنەکەدا قوت دەبووەوە و چرکەی لێ بەفیڕۆ نەدەدا.



بێگومان زۆر سەیرکردنی تەلەفیزیۆن دەبێتە هۆی ماندوویەتی. ئەوەبوو کەڵەشێری هاوڕێشمان بەیانییەکیان لەبەر ماندوویەتی خەبەری نەبووەوە. ئینجا ئەگەر کەڵەشێر خەبەری نەبێتەوە، ئەوە یەک کەسی تریش خەبەری نابێتەوە. جا لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیارانی کێڵگەکە بەخەبەر نەهاتبوون، بۆیە نە ئاژەڵەکان لەوەڕێندران، نە مەڕ و مانگاکانیش دۆشران. بەم جۆرە خەڵکەکە هەموو لە ئیش و کاریان دواکەوتن.



یەکەمجار خاوەن کێڵگەکە وای زانی کەڵەشێرەکە خوێندوویەتی و ئەم گوێی لێنەبووە. بەڵام کە چوار ڕۆژ لەسەریەک هەمان شت دووبارە بووەوە، خەریک بوو بەجارێک یاسا و ڕێسای کێڵگەکە تێک دەچوو. دانپێدانی پەلەوەرەکان و لەوەڕاندنی مەڕەکان درەنگ دەکەوت و هەمووان لە بارودۆخەکە ناڕازیبوون. کەچی کاکی کەڵەشێر بێ گوێدانە هەموو ئەم ڕەخنانە، یا لەپاش هەڵهاتنی خۆر یان هەر کاتێ خۆی هەستایە، ئەو کاتە دەستی دەکرد بە خوێندن.



خاوەن کێڵگەکە زۆر نیگەران بوو لەوەی کە کەڵەشێرە زیت و چالاکەکەی وای بەسەر هاتووە. تەنانەت ڕۆژێکیان کەکەڵەشێرەکە بە درەنگە وەختانێک قوقە قوقی نابووەوە، تاکە پێڵاوێکی شڕی تێگرت و لە قوقەی خست. بیریشی لەوە دەکردەوە کە شتێکی لێبکات. کەڵەشێرەکەش هەستی بەمە کردبوو.



ئەوەبوو خاوەن کێڵگەکە بە هاوسەرەکەی وت:

- ئافرەت، ئایا دەزانیت کەڵەشێرێک لە ناوەختدا بخوێنێت بۆچی باشە؟

- ئەی قابیلە نەزانم؟ هەر بۆ ئەوە باشە خپی بکەیت و شلەیەکی بەلەزەتی لێ دروست بکەیت.



- چی بکەین وابزانم کەڵەشێرەکەمان پیر بووە. سەیرکە، بەیانیان خەبەری نابێتەوە. ئەوە چەند بەیانییەکە بەهۆی ئەوەوە هەڵنەستاوین و لە ئیش و کارەکانیشمان بووین.

ژنەکەشی وتی:

- ڕاست دەکەیت پیاوەکە. چی بکەین مەگەر کەڵەشێرێکی تر بکڕین.

کەڵەشێرەکە هەر کە گوێی لەم قسانە بوو بەپەلە ڕایکردە کولانەکەوە و خێرا تەلەفیزیۆنەکەی خستەوە ناو کارتۆنەکەی و ناردییەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو. بە خەیاڵی ئەوەی کە سەری دەبڕن، ئەو شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوی. ئیتر بۆ ڕۆژی دواتر وەک جاری جاران لەو کاتەدا کە دەبوایە بخوێنێت، دەستی کرد بە قوقە قوق. بڕیاریشیدا کە خۆی بەشتی بێکەڵکەوە خەریک نەکات و زوو بنوێت و زوو لە خەو هەستێت.





ئیتر بەم جۆرە بووەوە بە کەڵەشێرەکەی جاری جاران
و ئەرکەکەی خۆی بە جوانترین شێوە بەجێ هێنا.



# ئەو ڕێوییەی لە پێکەنیندا قرتا

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. چەندین ساڵ لەمەوبەر ڕێوییەک هەبوو. ئەم ڕێوییەش بەهەمان شێوەی ڕێوییەکانی تر زۆر حەزی لە مریشک بوو. هۆکاری ئەم حەزەشی ئەو مریشکانە بوو کە حەپەلوشی کردبوون. هەرچۆنێک بێت ڕێوی فێڵباز توانیبووی سێ مریشک لە کێڵگەی نزیک دارستانەکەوە بدزێت و گەدەی خۆی لێیان پڕبکات.



خەڵکی کێڵگەکە وردە وردە بەهۆی دیارنەمانی مریشکەکانیانەوە کەوتنە ئامادە باشیەوە. بۆیە دەستیان کرد بە هێنانی سەگی ڕاهێنراو و هەڵکەندنی چاڵ بە دەوری کێڵگەکەدا. تەنانەت پەرژینێکی کارەبایی تایبەت بە ڕێویشیان دانا. بە هۆی ئەو تەڵانەوە کە خەڵکی دەیاننایەوە ڕێوییەکان قوربانییەکی باشیان دا. ئینجا باسی کامیانتان بۆ بکەم، ئەوانەیان کە سەگەکان دەیانگرتن و شلکوتیان دەکردن و دەبران بۆ نەخۆشخانە؟ یان ئەوانەی کە دەکەوتنە چاڵەوە و چەندین ڕۆژ بە برسێتی و تینوێتی دەمانەوە؟ یان ئەوانەی دەیانوت ڕێگایەکی نهێنیمان دۆزیوەتەوە کەچی کارەبا دەیگرتن و چاویان وەک گڵۆپ دادەگیرسا؟



پاش ئەو هەموو ئەو ناخۆشییانەی بەسەریاندا هات، ڕێوییەکان وازیان لە فڕاندنی مریشکی کێڵگەکە هێنا. تەنها ڕێویە چاوبرسییەکەی خۆمان وازی لەم خولیایەی نەهێنا. هەرچی هاوڕێ و پیاوماقوڵ و خزم و دۆستانی هەیە پێیان وت واز لەم کارەی بهێنێت، بەڵام بێ سوود بوو. سەری زمان و بنی زمانی ئەوەبوو دەیوت هەر دەبێت ڕێگەیەک بدۆزمەوە و تۆڵەی خۆمان لە مرۆڤەکان بکەمەوە.

ڕێوییەکە لەسەر بڕیارەکەی سووربوو. هەربۆیە چەندین ڕۆژ پلانی دانا و نەخشەی کێشا. چەندین هەفتە چاودێری کێڵگەکەی کرد و هەوڵیدا لە شێوازی نۆرەگرتنی پاسەوانەکان تێبگات. ئەوەندە چاودێری کێڵگەکەی کردبوو، تەنانەت دەیزانی هەر کولانە و چەند مریشکی تێدایە. جا ئەوە چییە؟! دەیزانی کام مریشکە هێلکە دەکات و کامەیان نایکات. کامیان قەڵەوە و کامیان لاوازە.





هەموو ئەمانەی لە دەفتەری پلانەکەیدا تۆمارکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی هەر خەیاڵی لای مریشکەکان بوو، سکی قۆڕەی ئەهات و خەوی بە نانی وشکەوە دەبینی. بەڵام پێی وابوو بە سەرگرتنی پیلانەکەی بەیانی و ئێوارە دەکەوتە مریشک خواردن.



ڕۆژان بەم شێوەیە تێپەڕی. تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان ڕێوییەکە ویستی بە سەر پەرژینەکەدا بازبدات، بۆ ئەم مەبەستەش پۆشاکێکی لەبەر کرد کە کارەبای نەدەگەیاند، بەڵام مراوییەکان بە قیقە قیق ئەو ناوەیان هێنایە سەیری. ئیتر ئەویش بەپەلە تێی تەقاند و لەبەرچاو ون بوو. جارێکی تریشیان لەترسی ئەوەی سەگەکان بیگرن خۆی هەڵدایە چەمەکەوە و خۆی لەدەستیان قوتارکرد. سەگەکانیش نەیانتوانی لەناو ئاوەکەدا بۆنی بکەن و شوێن پێکانی بدۆزنەوە.



ئیدی کار گەیشتە ئەوەی  ئەو مریشکە خرپنانەی کە شەو لە خەوندا دەیبینین، بە ڕۆژیش لە بەرچاوی ون نەدەبوون. وای لێ هاتبوو هەرشتێک لە دارستانەکەدا بجوڵایەتەوە وای دەزانی مریشکە. ئەم حاڵەتە ئاسایی نەبوو. بۆیە ڕێوییەکانی هاوڕێی ئامۆژگارییان کرد کە سەردانی پزیشکی دەروونی بکات. ئیتر ئەویش ناونیشانی پزیشکێکی شارەزای وەرگرت و بلیتی بڕی.

پزیشکەکە بە وردی گوێی بۆ بەسەرهاتەکانی مام ڕێوی گرت کە لە پێناو بەدەستهێنانی مریشکدا بەسەری هاتبوو. بەدەم قسەشەوە تێبینی خۆی وەردەگرت. پزیشکەکە کە بینی نەخۆشەکە حاڵی هێندە پەرێشانە، وای بە باش زانی کە بۆ ماوەیەک لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت.

یەکەم ڕۆژ کە ڕێوییەکە لە نەخۆشخانە کەوتبوو، پزیشکەکە هاتە لای و پەستانی خوێن و ڕێژەی تای پێوا.



که ڕۆیشتە دەرەوە بە پەرستارەکەی وت:

- نەخۆشەکەمان وزەیەکی زۆری لەدەست داوە. بۆیە پێویستە بەزووترین کات هێزی بێتەوەبەر بۆ ئەوەی بتوانێت لە لایەنی دەروونیشەوە خۆی کۆبکاتەوە. ئەگەر نانی ئێوارە داوای مریشکی برژاوی کرد بۆی بێنن.



پاشان پەرستارەکە چووەوە لای مام ڕێوی و پێی وت:
- مام ڕێوی ئازیز، بۆ ئەوەی تەندروستیت باشتربێت، وامان بەباش زانی بۆ نانی ئێوارە مریشکی برژاوت بۆ بێنین. جا ئێوە دەڵێن چی؟ حەزت لە مریشکی برژاو هەیە؟





ڕێویەکە باوەڕی بەگوێی خۆی نەکرد. دواتر دای لە قاقای پێکەنین، ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو بقرتێ. ئێ خۆ پێشینان وتوویانە: "لە ڕێوییان پرسی مریشک دەخۆیت، ئەویش لە پێکەنیندا نەیتوانی وەڵام بداتەوە."

# ئەو ڕێوییەی لە پێکەنیندا قرتا

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. لە دێر زەماندا کێڵگەیەکی بەخێوکردنی مریشکی خەپە و قەڵەو هەبوو. دارستانێکی پڕ لە گیانداریش دراوسێی ئەم کێڵگەیە بوو. لە دارستانەکەدا کۆمەڵێک ڕێوی دەژیان. ئەم ڕێوییانە هەموو خەو و خەیاڵیان ببووە مریشک دزین. بەڵام دوای ئەوەی خاوەنی کێڵگەکە هەموو ڕێیەکی لێگرتن، نانیان بڕا. دواتر ڕێوییەکان وازیان لە مریشک دزین هێنا و لە مریشکی کێڵگەکە بێهیوا بوون. بەڵام ڕێوییەکی چڵێس و نەوسن کە تەنها ئامانجی مریشک خواردن بوو، وازی نەهێنا و خۆی لەم پێناوەدا دانا. لە کۆتاییدا ڕێویەفەنی ئەوەندە پێکەنی تا خەریک بوو بقرتێت. حەزدەکەن بزانن ئەو شتە چی بوو کە مام ڕێوی خستە پێکەنین؟




دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+٩٦٤ (٠) ٧٥٠ ٧١٣ ٨٠٠٠




نرخی ٢٠٠٠ دینارە

